# گۆشتی بەراز

## لە ڕوانگەی زانستو ئاینەکانەوە








ڤایرۆسی ئەنفلوەنزای بەراز

ئامادەکردنی
د. پێشنیار محمد عطا

# گۆشتی بەراز
# لە ڕوانگەی زانستو ئایینەکانەوە

ئامادەکردنی: د. پێشنیار محمد عطا

سلێمانی ٢٠٠٩

چاپـــــــــــی یەکەم

**پێناسی کتێب:**

ناوی کتێب : گۆشتی بەراز لە ڕوانگەی زانستو ئایینەکانەوە

ئامادەکردنی: د. پێشنیار محمد عطا

بابەت: زانستی

چاپخانە: چاپخانەی سایە

تیراژ: ١٠٠٠

ژمارەی سپاردن (١٦٢٨) ساڵی ٢٠٠٩ وەزارەتی ڕۆشنبیری پێدراوە

# پێرست

# پێشـــــــەكی

مەبەست لە ئامادە كردنی ئەم بابەتە ووشیار كردنەوەی خەڵكیە بە هەندێك لە هۆكارە زانستیەكانی حەرام كردنی خواردنی بەراز و ئاشنابوونە بەو نەخۆشی یانەی ( نەخۆشی یە مرۆژەڵیەكان) كە لە بەرازەوە دەگوازرێتەوە بۆ مرۆڤ هەرچەندە كاتێك خوای میهرەبان خواردنی گۆشتی ئەم ئاژەڵە حەرام دەكات ئەوا پێویستی بە هیچ لێكۆڵینەوەیەك نی یە بۆ دۆزینەوەی هۆكارەكانی ئەم حەرامكردنە بەڵكو پێویستە بەبێ هیچ سەرپێچییەك فرمانەكانی جێبەجێ بكەین چونكە بەراستی هەر ئەو سەرچاوەی زانست و زانینە, ئەو زیانانەی كە بەهۆی خواردنی گۆشتی بەرازە وە توشی مرۆڤ دەبێت چەند سەدەیەكی پێویست بووە تا مرۆڤایەتی دۆزیویەتەوە ئەگەر مرۆڤەكانی سەدەكانی رابردوو پرسیان بكردایە بۆچی ئەم گۆشتە حەرامە ئەوا وەڵامیان دەست نەدەكەوت چونكە زانست لە وسەردەمانەدا نەگەیشتبووە ئەو ئاستەی كە وەڵامی پێبێت بۆ پرسیارەكان, ئەی ئەبێت چەند نەخۆشی و زیانی تریش هەبن كە لە سەدەكانی داهاتوو دا لێكدانەوەی زانستی بۆ دەكرێت لەوانەشە هەتا ژیان تەواو دەبێت مرۆڤایەتی نەتوانێت هەندێك هۆكاری تر بدۆزێتەوە,بەڵام دەبێت لەوە دڵنیابین كە حەرام كردنی خواردنی ئەم ئاژەڵە بەبێ هۆ نی یە و هۆكارەكانیشی لە زانستی خوای زانا و دانا دایە و هەندێكی درك پێ دەكەین و لەوانەیە هەندێكی تری درك پێ نەكەین .

د. پێشنیار محمد عطا

بەكالۆریۆس لە پزیشكی و نەشتەرگەری ڤێتێرنەری

دبلۆمی باڵا لە مۆلیكیولەر مایكرۆبایۆلۆجی

# کورتەیەك دەربارەی بەراز

بەراز ئاژەڵێکی گۆشتخۆر و گیاخۆرە (omnivores) کە لە پیسترین جێگەدا دەلەوەڕێت و ناتوانێت خواردنی پیس و پاك لەیەکتر جیا بکاتەوە هەر شتێك لە بەر دەمیدابێت دیخوات وەك زبڵ و خواردەمەنی وگۆشتی بۆگەن بەچکە بەرازی تۆپیوو و مشك و جرج و قوڕ و چڵپاو و پیسایی مرۆڤ تەنانەت پیسایی خۆیی و بەرازی تریش  هەندێك جار مەترسی بۆ سەر مرۆڤیش هەیە, هەندێك راپۆرت باس لەوە دەکەن کە بەراز  منداڵی پارچە پارچە کردووە و خواردویەتی .

بەگوێرەی ئەو ژینگەیەی کە بەراز تیادا دەژی و ئەو خواردنەی دیخوات وەك کێڵگەیەکی لێهاتووە بۆ زۆربەی مشەخۆر و بەکتریا و ڤایرۆسەکان هەروەك وەسف دەکرێت بە زبڵدانێك کە  لەسەر چوار پێ دەڕوات و نەخۆشی بۆ مرۆڤ دەگوازێتەوە .

چەندین هۆرمۆن و چەوری و ماددەی تری زیان بەخش لە پێکهاتەی گۆشتی بەراز دا بەدی دەکرێت کە زیان بەتەندرووستی مرۆڤ دەگەیەنێت, هەروەها ئەم ئاژەڵە بەر پرسیارە بەگواستنەوەی ٥٧ نەخۆشی مرۆژەڵی (نەخۆشیە گوازراوەکانی نێوان مرۆڤ و ئاژەڵ) کە ٣٢ نەخۆشییان بە هۆی مامەڵەی راستەوخۆی مرۆڤەوە دەگوازرێتەوە وە ٢٨ نەخۆشی

تـريش بـەهۆی پـیس بـوونی ژینگـەی مرۆڤـەوە و زیاترلـە ١٦ نەخۆشی دیکە بەهۆی خواردنی گۆشتی بەرازەوە دەگوازرێتەوە بـۆ مـرۆڤ . ئـەم نەخۆشیە گوازراوانـەش پێکهاتوون لـە ٣٠ نەخۆشـی مشەخۆری و زیـاتر لـە ١٥ نەخۆشـی تـر بـەهۆی بـەکتیریاوە و ٨ نەخۆشـی فایرۆسـی (کـە گرنگترینیـان ئـەنفلوەنزای بـەرازە) و هەروەها ٣ نەخۆشی تر کە هۆکاری کەڕوەکانەوە .

ئەگەر پرسیار بکرێت کەواتـە بۆچی بـەراز بـەخێو دەکرێت ؟ لـە وەلآمدا :

بەراز لەتەمەنی ٤-٥ مانگی دا توانای ئاوس بوونی هەیـە وە هـەموو ٢١ رۆژ جارێـك مێیـەکان ئامـادە دەبـن بـۆ جـووت بـوون وە مـاوەی ئاوس بوون ٣مانـگ و ٣ هەفتەیە وە هەر مالۆسێك بـە یـەك جار ٢-١٢ بێچووی (پەڵخ) دەبێـت بـەم شـێوەیە لـەماوەی ساڵێکدا ٢ جـار مـالۆس ئـاوس دەبێـت واتـە لـەماوەی سـاڵەکەدا بـەتێکرا ١٥-٣٠ بەچکەی دەبێت ,

بەراز زۆر بە خێرایی گەشە دەکات بـەهۆی بـوونی ڕێژەیـەکی زۆر لـە هۆرمـۆنی گەشـە (growth hormones) لـە لەشـی دا بـە جۆرێك لەکاتی زایینی دا ٢ کیلۆگرامە لـەماوەی ٦ مـانگ دا ٥٠ جـار کێشی زیـاد دەکـات تـا دەگاتـە ١١٢ کیلـۆگرام, ئەگـەر بـەراوردێك لـە نێوان بەخێوکردنی مەڕ و بزن و بەرازدا بکـەین دەبینین کـە لـە ساڵکدا ١-٢ کـار و بـەرخی دەبێـت واتـا ئەگـەر کەسێك ١٠٠ مـەری

هەبێت لەکۆتایی ساڵەکەدا ڕانەکەی دەبێتە ٢٠٠ سەر بەلاّم ئەگەر ١٠٠ بەرازی هەبێت ئەوا بەرهەمەکەی دەبێتەزیاتر لە ٢٠٠٠ سەر ئەمە جگە لەوەی کێشی هەرمەڕێك ئەو پەرەی ٥٠ کیلۆگرامە بەلاّم هەر بەرازێك نزیکەی ١٠٠ کیلۆگرامە.

واتا ٢٠٠ مەڕ × ٥٠ کیلۆ گرام = ١٠,٠٠٠ کیلۆ کێشی زیندوو

٢٠٠٠ بەراز × ١٠٠ کیلۆ گرام= ٢٠٠,٠٠٠ کیلۆ کێشی زیندوو

ئەمەش وەلاّمی ئەو پرسیارەمان دەداتەوە کە بۆچی بەراز بەخێو دەکرێت لەگەڵ زانینی ئەو هەموو زیانانەی کە هەیەتی.

/

# ئەو ئاین و باوەڕانەی کە گۆشتی بەرازیان حەرام کردووە

## (١) ئاینی ئیسلام

خوای گەورە گۆشتی بەرازی لەسەر هەموو موسوڵمانیك حەرام کردوە بە چوار ئایەتی پیرۆز کە لە قورئاندا هاتووە:

١- ﴿إِنَّمَا حَرَّمَ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةَ وَالدَّمَ وَلَحْمَ الْخِنْزِيرِ وَمَا أُهِلَّ بِهِ لِغَيْرِ اللَّهِ فَمَنِ اضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلَا عَادٍ فَلَا إِثْمَ عَلَيْهِ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾
(البقرة ١٧٣)

واتە خوای پەروەردگار گۆشتی مردارەوە بوو و خوێن و گۆشتی بەرازی لەسەر حەرام کردوون هەروەها حەرامە هەر ماڵاتێك ناوی کەسێکی تری لێ بهێنرێت لەکاتی سەربڕیدا جگە لە خوا بەڵام ئەگەر کەسێك پێویستی ناچاری کرد بێ زیادە ڕەوی و لەسنوور دەرچوون ئەوا گوناحی لەسەر نیە وە خوا میهرەبان و بەخشندەیە.

٢- ﴿إِنَّمَا حَرَّمَ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةَ وَالدَّمَ وَلَحْمَ الْخِنْزِيرِ وَمَا أُهِلَّ لِغَيْرِ اللَّهِ بِهِ فَمَنِ اضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلَا عَادٍ فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾
(النحل ١١٥)

واته خوای پەروەردگار گۆشتی مردارەوە بوو و خوێن و گۆشتی بەرازی لەسەر حەرام کردوون هەروەها حەرامە هەر ماڵاتێک ناوی کەسێکی تری لێ بهێنرێت لەکاتی سەربڕیدا جگە لە خوا بەڵام ئەگەر کەسێك پێویستی ناچاری کرد بێ زیادە ڕەوی و لەسنوور دەرچوون ئەوا گوناحی لەسەر نیە وە خوا میهرەبانەو بەحشندەیە.

٣- ﴿حُرِّمَتْ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةُ وَالدَّمُ وَلَحْمُ الْخِنْزِيرِ وَمَا أُهِلَّ لِغَيْرِ اللَّهِ بِهِ وَالْمُنْخَنِقَةُ وَالْمَوْقُوذَةُ وَالْمُتَرَدِّيَةُ وَالنَّطِيحَةُ وَمَا أَكَلَ السَّبُعُ إِلَّا مَا ذَكَّيْتُمْ وَمَا ذُبِحَ عَلَى النُّصُبِ وَأَنْ تَسْتَقْسِمُوا بِالْأَزْلَامِ ذَلِكُمْ فِسْقٌ الْيَوْمَ يَئِسَ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ دِينِكُمْ فَلَا تَخْشَوْهُمْ وَاخْشَوْنِ الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الْإِسْلَامَ دِينًا فَمَنِ اضْطُرَّ فِي مَخْمَصَةٍ غَيْرَ مُتَجَانِفٍ لِإِثْمٍ فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾

(المائدة ٣)

واته خوای پەروەردگار گۆشتی مردارەوە بوو و خوێن و گۆشتی بەرازی لەسەر حەرام کردوون هەروەها حەرامە هەر ماڵاتێک ناوی غەیری خوای لێ بهێنرێت لەکاتی سەربڕیدا هەروەها ماڵاتی خنکاو ئەوەش کەبەئازارو لێدانەوە مردار دەبێتەوە ئەوەش کە دەکەوێتە خوارەوە ئەوەش کەبە لێدانی ماڵاتێکی تر مردار بووبێتەوە ئەوانەش کە دڕندە پەلاماری دابن و لێیان خواردبن

هەمویان حەرامن ( هەموو ئەو حەلاَتانە گەر بەچەقۆدا بگەن حەلالْن) ..... هەتا كۆتایی ئایەتەكە

٤- ﴿ قُلْ لا أجِدُ في مَا أُوحيَ إلَيَّ مُحرَماً عَلَى طَاعم يطعمُهُ إلَّا أنْ يَكُونَ ميْتَةً أَوْ دَماً مسْفُوحاً أَوْ لحْم خنْزِير فإنَّهُ رجْسٌ أَوْ فسْقاً أُهلَّ لغيْر اللَّه بِه فَمنِ اضْطرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلا عَاد فَإنَّ ربَّكَ غفُورٌ رحيمٌ ﴾

( الانعام ١٤٥ )

واتە ئەی محەمەد (صلى الله عليه وسلم) پێیان بڵێ :من نابینم لەوەی كە وەحیم پێكرابێت كە هیچ خواردنێك حەرام كراوە لەسەر ئەو كەسەی كە بیخوات , مەگەر خواردنێكی مردارەوە بوو یان خوێنێكی ڕژێنراو , یان گۆشتی بەراز ئەوانە هەر پیسن , یان حەرامە هەر ماڵاتێك ناوی كەسێكی تری لێ بهێنرێت لەكاتی سەربڕین دا جگە لە خوا بەڵام ئەگەر كەسێك پێویستی ناچاری كرد بێ زیادە ڕەوی و لەسنوور دەرچوون ئەوا گوناحی لەسەر نی یە وە خوا میهرەبان و بەحشندەیە.

**(٢) ئاینی جولەکە**

تەورات ( سەردەمی کۆن) یەکێکە لە کتێبە ئاسمانیەکان کە خوای میهرەبان بۆ یەهودییەکانی ناردووە وە تیایدا هاتووە کە گۆشتی بەراز حەرامە, دەقەکەی بە زمانی عەرەبی :

« إن الخنزير من الحيوانات التى لا تجتر طعامها ، إنه غير طاهر ويسنع بتاتاً أكل لحمها ، أو حتى لمسه إذا كان ميتاً ، إنه قذارة للإنسان » . ( سفر ١١ ــ ٧ ، ٨ )

واتە بەراز لەو ئاژەڵانەیە کە گۆشتەکەی ناخورێت وە پاك نیە وە بەهیچ شێوەیەك نابێت گۆشتەکەی بخورێت یان لێی بکەویت ئەگەر مردبێت , بەراز گلاوە بۆ مرۆڤ .

**(٣) ئاینی مەسیحی**

لەسەر هەموو مەسیحیەك پێویستە کە گۆشتی بەراز نەخوات چونکە بەگوێرەی ئەو ئامۆژگاریانەی کە لە ئینجل دا هاتووە پێویستە کە باوەڕیان بە ئاینی پێشوو(سەردەمی کۆن) هەبێت وەك باوەڕیان بە سەردەمی تازە هەیە وە بە گوێرەی ئەوەی لە سەردەمی کۆن گۆشتی بەراز حەرامکراوە کەواتە لە دینی مەسیحیش دا حەرامە.

لـه ئينجيلـى متـى ٥: ٨ و ٩ هـاتووه : ( **لا تظنـوا أنـي جئـت لأنقض الناموس أو الأنبياء ما جئت لأنقض بل لاكمل فإني الحق أقول لكم إلى أن تزول السماء والأرض لا يزول حرف واحد أو نقطة واحدة من الناموس** ).

واتـه مـن نـه هـاتوونم لـه شـهريعهتهكان و پێغهمبـهرهكان كـهم بكهمـهوه بـهڵكو هـاتووم تهواوكـهرى ئـهوان بم , ئهمـهش ئـهوه روون دهكاتهوه كه بهرنامهكهى حـهزرهتى عيـسى تـهواو كـهرى بهرنامهكهى موسى پێغهمبهره و هيـچ جياوازيهكى نى يه.

**پێويسته به دڵنياييهوه بروامان ههبێت كه خـواى گـهوره كاتێـك شتێك لهسهر بهندهكانى حـهرام دهكات ئـهوا بهيهكسانى گشتاندن دهكات له ههموو ئاينهكاندا چونكه هيچ حيكمهتێك لهوهدانيـه كـه خواردنى بهراز له تهورات و قورئاندا حهرام بێت بهلأم لـه ئينجيـل دا حهلأڵ بێـت كـه ههموويان لـه لايـهن يـهك خـواى تـاك و تـهنياوه نێراون.**

## (٤) هندۆس

شوێن كهوتوانى بـاوهڕى هندوسى گۆشتى بـهرازيان لهسـهر خۆيـان حـهرام كـردوه بهشـێوهيهك كـه نابێـت بـه هـيچ جۆرێـك بـهكارى بهێنن بهلأم لهبارهى خواردنى گۆشتى مانگـاوه زۆربـهى رۆشـنبير و

-خوێنەوارەکان ئەڵێن هیچ دەقێکی کتێبی موقەدەسی هندوس نی یە کە حەرامی کردبێت.

## (٥) زەردەشت

ئاینی زەردەشت کە نزیکەی ٥٥٠ ساڵ پێش زاین هەبووە و تا ئێستاش کەمینەیەك لە هندستان شوێنکەوتەی ئەم ئاینەن گۆشتی بەراز ناخۆن.

## (٦) یەزیدی

بەپێی بیر وباوەڕەکانی یەزیدیەکان بەراز گڵاوە و خواردنی گۆشتکەشی حەرامە .

## (٧) سبتی

شوێنکەوتوانی ئەم باوەڕە هەندێك لە ڕەگەزە مەسیحیەکانی ئەوروپان لایان روون بوەتەوە کە لەتەوراتدا گۆشتی بەراز حەرام کراوە بۆیە گۆشتی بەراز لە خواردەمەنیەکانیاندا بەکار ناهێنن.

(٨) بوزی

گۆشتی بەراز لەسەر گشت شوێنکەوتوانی ئاینی بوزی حەرامە هەرچەندە لای بووزیەکان کوشتن بەهەموو شێوەیك حەرامە ئەمە کوشتنی هەموو زیندەواران و مێرووش ئەگرێتەوە .

**(٩) کۆنفۆشیوسی**

**ئەو صینیانەی لە شوێنکەوتوانی کۆنفۆشیوسین گۆشتی بەراز لە لایان حەرامە بەگوێرەی ئەوەی کە لە کتێبەکەیاندا هاتووە کە بەدەق دەڵێت نابێت بۆ هیچ مرۆڤێك گۆشتی بەراز و سەگ بخوات.**

**پێکهاتەی گۆشتی بەراز و زیانەکانی خواردنی لەلایەن مرۆڤەوە**

١. یەکێك لەو هۆکارە زانستیانەی کە زیانەکانی بەرازی تیادا ڕوون دەبێتەوە پێکهاتەی رۆنی بەرازە کە لەتێکرای یەك کیلو گرام گۆشتی بەراز نیو کیلۆگرامی چەوریە ,جگە لەو چەوریەی لە دەرووەی ریشاڵە گۆشتیەکان ژمارەیەکی زۆر لە چەوری لە ناوخانەکانی بەراز دایە ئەمەش لەگیانەوەرانی تردا نیە ئەم چەوریەش بە بەراورد لەگەڵ گیانەوەرەکانی تردا برێکی زۆر ی کۆلیسترۆلی زیان بەخشی تیادایە کە مەزەندە دەکرێت بە دە ئەوندەی ئەو رێژەیەی کە لە گۆشتی مانگادا هەیە وە کۆلیسترۆلی زیان بەخشیش دەبێتە هۆی رەق بون و ئەستوربوونی بۆریەکانی خوێن و بەرز بوونەوەی پەستانی خوێن و جەڵتەی دڵ هەروەها کۆلیسترۆڵ لە دیواری خانەکانی شێرپەنجەشدا هەیە.

٢. پرۆفیسۆر دکتۆر هالزهیتش باس لەوەدەکات کە بە تاقیکردنەوە سەلێنراوە ئەو کەسەی کە زۆر پشتەمەغزەی بەراز دەخوات مل و شان و پشتی چەوری زیاتر دەگرن وە هەروەها ئەوانەی گۆشتی رانی بەراز دەخۆن ڕانیان ئەستورتر دەبێت

ئەوەش لە بەر ئەوبە دوای هەرسکردن -چەوری بەراز وەك خۆی دەمێنێتەوە و لەو شوێنەدا جێگیر دەبێت کە لەبەرازەکە هەبووە.

٣. مرۆڤ توشی گرفتەکانی هەرس دەبێت لە ئەنجامی خواردنی گۆشتی بەرازەوە چونکە رۆنی بەراز درەنگ هەرس دەبێت بۆیە ئەگەر گۆشتی مانگا بە ٣ کاتژمێر هەرس ببێت ئەوا گۆشتی بەراز ٤ کاتژمێری پێویستە بۆ هەرس بوون.

٤. گۆشتی بەراز هەندێك جار مرۆڤ توو شی گرفتەکانی حەساسیەت و ئالۆش و برینی گەدە دەکات چونکە گۆشتی ئەم ئاژەڵە برێکی زۆر هستامین و ئمیدازۆلی تێدایە کەمرۆڤ توشی خوران و هەوکردن ( inflammation) و سوربونەوەی پێست دەکات بۆیە هەندێك لەوانەی کە تووشی نەخۆشیەکانی خورانی پێست و ئازاری گەدە دەبنەوە کاتێك واز لەخواردنی بەراز دەهێنن لەو گرفتانە رزگاریان دەبێت. هەروەها گۆشتی بەراز برێکی زۆر لە هۆرمۆنەکانی گەشە کردنی تیادایە کەهاندەری گەشەی نارێك و پێك و هەندێك جار هاندەری گەشەسەندی خانەکانی شێرپەنجەیە و هەوەکردنن .

٥. گەر پارچەیەك لەگۆشتی مەڕ و مانگا و بەراز لەبەر هەتاو دابنرێت دەبینین بەزوویی گۆشتی بەرازەکە بۆگەن دەکات پاشان مەڕ ئینجا مانگا هەندێك جار لەوانەیە گۆشتی مانگاکە وشك ببێتەوە بێ ئەوەی بۆگەن بکات , لێکدانەوەی زانستی بۆ ئەوەی

که گۆشتی بەراز هەڵگری ڕێژەیەکی زیاترە لە میکرۆب ئەوەیەکە گۆشتی بەراز بڕێکی کەمتر لە گلایکۆجین تیادایە بە بەراورد لەگەڵ ئەو گیانەوەرانەی گۆشتیان دەخورێت , سودی گلایکۆجین لەژیاندا ئەوەیە بە کارلێکە کیمیایەکان دەگۆڕێت بۆ شەکرەکان کە لەش وەك ووزە بەکاری دەهێنێت وە لەپاش سەربڕینی گیانەوەرەکە هەندێك بەکتریای سوود بەخش هەن microflora وەك acidophilus گلایکۆجین دەگۆڕن بۆ ترشەکان بۆیە بەبڕێکی کەم ڕادەی ناوەندی ترشێتی لەش بەرز دەبێتەوە کە دەبێتە هۆی لەناو بردنی زۆربەی زۆری بەکتریاکان (هەتا ماوەیەکی دیاری کراو) بەڵام لەبەر ئەوەی گۆشتی بەراز بڕێکی کەمی لە گلایکۆجین تیدایە ئەم روداوەش کەمتر روودەدات بۆیە گۆشتی بەراز هەڵگری ڕێژەیەکی زۆری بەکتریایە و خێرا بۆگەن دەکات .

٦. چەوری بەراز زۆر بەخێرایی دەئۆکسێت لە هەوادا بۆیە دەبێت لە خوار ١٤ پلەی سەدی هەڵبگیرێت بەبەراورد لەگەڵ چەوریەکانی تردا کە دەتوانرێ لەم پلەیەدا هەڵبگیرێت هەروەك ڕۆنی بەراز (گۆشتەکەشی) خێراتر بۆگەن دەکات چونکە دوای سەربڕین ڕێژەی ٪٢ ترشەچەوریە سەربەستەکانی تیادایە , ئەمە جگە لەوەی ئەم پێکهاتەیەی ڕۆنی بەراز زۆر زیاتر لەلایەن

ڕیخۆڵکانەوە هەڵدەمژرێت و لە لەش دا کۆ دەبێتەوە و دەبێتە هۆی قەڵەوی و گرفتەکانی.

٧.هەندێك لە لێکۆڵینەوەکان دەری دەخەن کە ڕۆنی بەراز کە هەلگری بڕێکی زۆر لە گۆگردە هۆکاری شێرپەنجەیە لە ئەندامەکانی لەشی مرۆڤ دا وەك کۆڵۆن و پرۆستات و مەمك و پەنکریاس و منداڵدان و زراو.

٨. بەستەرە شانەکانی بەراز کە ڕێژەیکی زۆر پێکهاتەی گۆگردی تیایە وەك (sulphuric acid), (sulphuric acid mucoitin) دەبێتە هۆی نیشتنی میوکەس(mucus) لە ژێکان و کرکراگەکاندا وە دەبێتە هۆی هەوکردنی جومگەکان و ڕۆماتیزم. بوونی ئەم ڕێژە زۆرەی گۆگرد ئەو گرفتە ڕووندەکاتەوە کە لەکۆندا هەمیشە ئەو مەنجەڵە گلێنانەی کە گۆشتی بەرازیان تیدا کوڵاوە هەمیشە بۆنی ناخۆشیان لێهاتووە بەهۆی بوونی گازی هایدرۆجینی گۆگرد ( $H_2S$ ) هەروەها ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە لاکی بەرازی تۆپیو بۆنی ناخۆشترە بە بەراورد لەگەڵ ئەو گیانەورانەی کە گۆشتیان دەخورێت.

# هەندێك لە نەخۆشیە گوازراوەكانی نێوان بەراز و مرۆڤ

## نەخۆشی یە مشەخۆریەكان

**فاشیۆلۆپسس بوسكی** *Fasciolepsis buski*

مشەخۆرییێكە لەناو ریخۆڵە باریكە و گەدە و كۆلۆنی بەرازدا دەژی بەشێكی قۆناغەكانی سوری ژیانی. لە قۆزاخەی ئاوی دا تەواو دەكات پاشان مرۆڤ توش دەكات

نیشانەكانی لە بەرازدا : نیشانەیەكی تایبەتمەند و ئاشكرای نیە.

نیشانەكانی لە مرۆڤ دا : سكچوونی بەردەوام, دروسكردنی برین لەسەر ڕووپۆشی ریخۆڵە, لاوازی و كەم خوێنی.

## بەلهاریزیا Schistosomiasis.

*ناوی مشەخۆر* : شیستۆسۆما جاپۆنیكەم .. *Schistosoma japonicum*

بەرازو مرۆڤ یەكێكن لەو زیندەوەرانەی كە هەلگری ئەم مشەخۆرەن كەلە ناو بۆریە خوێنیەكانی هەناودا خۆیان جێگیر دەكەن . مشەخۆرەكە بۆ تەواو كردنی سوری ژیانی پێویستی بە

قۆزاخەی ناو ئاو شەیە کەبەشێك لە سووڕی ژیانی لە ویندا تەواو دەکات پاش جەند قۆناخێکی گەشەکردن کرمۆکە کەپێی دەڵێنن سێرکاریا لە ناو ئاودا مەلەدەکەن دەتوانن کە لەنێوان پێستی تەنکی لەشەوە یا ن لەرێگەی دەمەوە بچنە ناو لەشەوە دوبارە بەخوێندا دەڕۆات تا لە بۆریە خوێنیەکانی هەناودا خۆیان جێگیر دەکەن. لەبەر ئەوەی بەراز حەزی لە خۆ گەوزاندن و خواردنە لە زەلکاو قوڕ چڵپاودا بۆیە ژینگەیەکی لەبار بۆ نەخۆشیەکە دروست دەبێت لەنێوان مرۆڤ و بەراز و قۆزاخە ئاویەکاندا .

نیشانەکانی لە بەرازدا · لاوازی , کەم خوێنی , لەکاتی سەختی نەخۆشی یەکەدا بەمردن کۆتایی دێت.

نیشانەکانی لە مرۆڤ دا : مشەخۆرەکە تا دەگاتە شوێنی جێگیری خۆی بەناو هەندێك لە ئەندامەکانی لەشدا دەڕوات بۆیە بەگوێرەی ژمارەی مشەخۆرەکان و ئەو ئەندامەی کە پیادا تێدەپەڕێت نیشانەکان دەگۆڕێت بۆ نمونە کاتێك بە درکە پەتك و دەمارەکاندا دەڕوات توشی ئیفلیجی و مردن دەبێت.

## کرمی شریتی بەراز Pork tapeworm

ناوی مشەخۆر: تینیا سۆلیوم *Taenia solium*

مشەخۆرەکە نزیکەی ٢ ٥ م دەبێت لەدرێژیدا لەریخۆڵە باریکەی مرۆڤ دا دەژی کاتێك هێلکەی ئەم کرمە لەگەڵ پاشەڕۆدا

دێتەدەرێ, ئەم هێلکانە لەگەڵ خواردنی پیس بووی بە پاشەڕۆی مرۆڤ دەچێتە ناو گەدەی بەرازەوە پاشان لەریخۆڵەکاندا دەتروکێت وکرمۆکەی چالاك دێتەدەرەوە و دیواری ریخۆلە کون دەکات و لەڕێگەی خوێنەوە بۆ ماسولکەکانی بەراز دەگوازرێتەوە ولەوێدا جێگیردەبن و تورەکە کرمی پچوك دروست دەکەن , کاتێك کە مرۆڤ گۆشتی باش نەکولاوی بەراز یان بەرهەمەکانی گۆشتی بەراز دەخوات کە زۆرجار بە پلەیەکی گەرمی کەم ئامادە دەکرێت ئەوا ئەو کرمۆکانە لەناو گەدەدا چالاك دەبن دوبارە دەبنەوە بە کرمی هەراش.

هەندێك جار پاش ئەوەی مرۆڤ گیرۆدەی ئەم مشەخۆرە دەبێت لە ریخۆڵەی دا لەوانەیە لەڕێگەی خواردنی پیس بوو بە هێلکەی کرمەکە کەسانی تر یان خۆی توشی تورەکە کرمی گۆشتی بەراز بکەن کە بۆ ماوەیەکی زۆر لە *Cysticercus cellulosae* ماسولکەکان , جگەر , سی یەکان ، چاو, دڵ یان مێشکی مرۆڤ دا دەمێنێتەوە.

نیشانەکانی لەبەرازدا: نیشانەکانی لەبەرازدا دەرناکەوێت بەلأم گەر بەرێژەیەکی زۆر تورەکە کرمی گۆشتی بەراز لە ماسولکەکانیدا هەبوو ئەوا توشی رەق بوونی ماسولکەکانی دەکات.

نیشانەکانی لەمرۆڤدا:

١- كاتێك مرۆڤ تووشی كرمی هەراش دەبێت لە ریخۆڵدا نیشانەكانی بریتیە لە سك ئێشە، سكچوون، قەبزی ، نائارامی،لاوازی، كۆمەخوری، هاتنە دەرەوەی پارچەكانی كرمەكە لە كۆمەوە.

٢- كاتێك مرۆڤ تووشی تورەكە كرمی گۆشتی بەراز دەبێت نیشانەكانی دەگۆرێت بەگوێرەی ئەو جێگەیەی كە تورەكە كرمەكە تیادا جێگیر بووە لەوانەیە تووشی شێتی ، ئازاری رۆماتیزمی، كوێربوون، یان مردن ببێت.

## كرمی بازنەیی (ئەسكارس) Round worm

كرمی ئەسكارس بەراز *Ascaris suum* بەگەورەترین كرمەكانی ناو كۆئەندامی بەراز دادەنرێت كە درێژیەكەی دەگاتە ٢٠-٤٠ سم وە یەكێكە لەو مشە خۆرانەی كە بۆ مرۆڤ دەگوازرێتەوە كاتێك كە هێلكەی كرمەكەلەگەڵ پاشەرۆدا دێتە دەرێ وە دەتروكێت لەرێگای خۆراكی پیس بووەوە دەچێتە ناو لەشی مرۆڤەوە ,بەزوربەی ئەندامەكانی لەش دا دروات وەك ریخۆڵە و جگەر و دەمارەكانی خوێن و پەنكریاس و گورچیلە و سی یەكان و بۆری و بۆریچكەكانی هەوا دواجار لە ریخۆڵەدا جێگیر دەبێت.

نیشانەکانی لە مرۆڤدا: لاوازی، کەم خۆراکی، ڕشانەوە، سکچوون، هەوکردنی جگەر و گورچیلە و پەنکریاس و سیەکان، گیران بۆریچکەکانی هەناسە و گیران و لوولبونی ریخۆڵەکان.

## تریخینیۆلۆسس Trichinellosis

ناوی مشەخۆر: تریخێنێلا سپایرالس *Trichinella spirals*

مشەخۆری هەراش نزیکەی ١,٥ - ٣,٥ ملم درێژە لە ناوپۆشی بەشی سەرەوەی ریخۆڵە باریکەی بەراز و جرج و مرۆڤ و هەندێك شیردەری تر دا دەژی , کرمۆکەکان لە مێینەکانەوە دێنە دەرەوە بەخوێندا بە گشت ماسولکەکانی لەش دا بلاْو دەبنەوە لەوێدا گەشەدەکەن و خۆیان لول دەکەن و کەپسولێك بەدەوریدا دروست دەبێت کە بۆ ١٢ ساڵ لە بەرازدا دەتوانێت بمێنێتەوە, کاتێك کە مرۆڤ گۆشتی باش نەکولاْوی بەراز یان بەرهەمەکانی گۆشتی بەراز دەخوات کە زۆرجار بە پلەیەکی گەرمی کەم ئامادە دەکرێت ئەوا ئەو کرمۆکانە لەناو گەدەدا چالاك دەبن و دوبارە دەچنە ناو روپۆشی ریخۆڵە و دواتر دەبنە کرمی هەراش و پاشان کرمۆکە دروست دەکەن کە بەهەمان شێوەی کە لە ماسولکەی بەرازدا باسمان کرد لە ماسولکەی مرۆڤیش دا جێگیر دەبێت و کەپسولێك بە دەوری خۆی دروست دەکات کە بۆ ماوەی ٣١ ساڵ لە ماسولکەی مرۆڤدا دەمێنێتەوە.

نیشانەکان لەبەرازدا : زۆربەی جار نیشانەی دەرناکەوێت .

نیشانەکانی لە مرۆڤدا : سکچوون. ڕشانەوە , بەرز بوونەوەی پلەی گەرمی, سەرئێشە, ئاوسانی پێڵوەکانی چاو, ئارەق کردنەوە, ئازارو کرژ بوون و کفت بوونی ماسوولکەکان ,هەوکردنی ماسولکەو پەردەی دڵ ,ئاوبەن ,ئیفلیجی ماسولکەکانی پەراسوو و مردن.

## کرمی سی Paragonimus

ئەم کرمە لەسی یەکانی بەرازدا دەژی وەلەو شوێنانەدا هەیە کەبەرازی تیادا بەخێو دەکرێت لە لایەن مرۆڤەوە بەپێچەوانەوە لەو ناوچانەدا نیە کە بەرازی تیا ناژی.

نیشانەکانی نەخۆشی یەکەلە مرۆڤ دا: کۆکە, بەڵغەمی قاوەیی, خوێن بەربونی سی یەکان.

## کلۆنۆرکس سینینسس (*Clonorchis sinensis*)

کرمێکی مژۆکە لە بۆریەکانی زراوی بەرازدا دەژی وە لەو ناوچانەدا هەیە کە بەرازی تیدا بەخییو دەکرێت وە دەگوازرێتەوە بۆ مرۆڤ.

نیشانەکانی نەخۆشیەکە لە مرۆڤ دا: ئاوسانی جگەر, سکچوون, لاوازی, مردن.

## جایگانپورینکس Giganthorinchus

ئەم کرمە لە ریخۆڵەکانی بەرازدا دەژی. نیشانەکانی نەخۆشیەکە لە مرۆڤدا:

کرمەکە بەدیواری ریخۆڵە کوێرەی مرۆڤەوە خۆی هەڵواسیوە و بەردەوام خوێن دەمژێت بۆیە نەخۆش توشی کەم خوێنی و لاوازی و تێکچونی هەرس دەبێت.

## ماکراکانپورینکوسس Macracanthorhynchosis

ناوی مشەخۆر : Macracanthorhynchus hirudinaceus:

ئەم مشەخۆرە تایبەتە بە ڕیخۆڵە باریکەی بەراز هێلکەی ئەم کرمە لە گەڵ پاشەڕۆ دێتە دەرەوە و لەلایەن کرمۆکەی قالۆنچەوە دەخورێت کاتێك مرۆڤ بەرێکەوت ئەم کرمۆکانە لە گەڵ خۆراکدا دەخوات توشی ئەم نەخۆشیە دەبێت یان لەهەندێ لە خەڵکانی( فۆلگا فالی ) کە قالۆنچە دەخۆن بە ڕێژەیەکی زیاتر تووش دەبن.

نیشانەکانی لە بەراز دا: لە نەخۆشی سووکدا نیشانەکانی دەرناکەون , هەوکردنی ریخۆڵە , کەم لەوەڕی , نائارامی , دابەزینی کێشی لەش, کون کردنی دیواری ریخۆڵە.

نیشانەکانی لە مرۆڤ دا : لاوازی, کەم خوێنی, هەوکردنی ریخۆڵە.

## ئۆسۆ فیگەستۆمۆسس Oesophgoatomosis

ناوی مشەخۆر: *Oesophgoatoma bifurcum*

مشەخۆر لە ریخۆڵەی بەراز دا هێلکە دەکات لەگەڵ پاشەرۆدا دێتە خوارەوە کرمۆکەکان لە خاك دا گەشە دەکەن کاتێك مرۆڤ لەگەڵ خواردن و خواردنەوەی پیس بوو دا دەیخوات لە ریخۆڵەدا هەندێکیان دەبنە کرمی تەواو وە هەندێکیان بەشێوەی کرمۆکەیی دەمێنێتەوە کە دەبنە هۆی دروستکردنی گرێ لە دیواری پەردەی ریخۆڵەکان و تەنانەت دیواری سکیش کە تەنیا بە نەشتەرگەری لادەبرێت.

## گۆنگایلۆنۆمۆسس Gongylonimosis

ناوی مشەخۆر: *Gongylonima pulcrum*

بەراز یەکێکە لەو گیانەوەرانەی کە ئەم مشەخۆرەی تێدایە وە لەدیواری سورێنچك و زمان و دەم و ریخۆلەدا دەژی کرمۆکەی ئەم مشەخۆرە لە میروو دا قۆناغێکی سوڕی ژیانی تەواو دەکات هەندێك جار ئەم مێروانە لەگەڵ ئاو و خۆراکدا بە رێکەوت لەلایەن مرۆڤەوە دەخورێت بەم شێویە مشەخۆرەکە دەگوازرێتەوە بۆ مرۆڤ.

## بەلانتیدیۆسس Balantidiosis

ناوی مشەخۆرەکە: بەلەنتیدیەم کۆلی *Balantidium coli*

مشەخۆرەکە لەگروپی پرۆتۆ زواکانە وە لە ریخۆلّە ئەستورەی بەرازدا دەژی لەرێی ئاو یان خواردەمەنی پیس بوو بە پاشەرۆی بەرازەوە دەگوازرێتەوە بۆ مرڤ.

نیشانەکانی لە بەرازدا: لاوازی, کەم خوێنی, هەوکردنی جگەر, دروس بوونی برینی ریخۆڵە.

نیشانەکانی لە مرۆڤ دا : داماڵینی روپۆشی ریخۆڵە, سکچوونی ئاوی , هەوکردنی ریخۆڵە ئەستورە ,لەهەندێ نەخۆش دا کە لاوازن لەوانەیە ببێتە هۆی مردن .

## تریپانۆسۆمای ئەمەریکی Americ trypanosomaisis

ناوی پرۆتۆ زوا: *Trypanosoma cruzi*

بەراز یەکێکە لەو گیانەوەرانەی کەتوشی ئەم مشەخۆرە دەبێت وە لە خوێندا دەمێنێتەوە. مێشولەهۆکاری گواستنەوەی مشەخۆرەکەیە کە بەشێك لە قۆناخەکانی سوڕی ژیانی تێدا تەواو دەکات نەخۆشەکە بۆ مرۆڤ دەگوێزرێتەوە کاتێك مێشولەکە پاشەرۆ لەسەر برین یان رووپۆشی دەم و پێلوی چاو دادەنێت

هـەروها لەمرۆڤـەوە بـۆ مـرۆڤ دەگوازرێتـەوە لـە کـاتی خـوێن بەخشیندا.

نیـشانەکانی لەبـەرازدا: ئاوسـان ,بـەرز بوونـەوەی پلـەی گـەرمی, دابـەزینی کـێش, کـەم خـوێنی , مـردن بـە هـۆی تێکـشکانی ماسولکەکانی دڵ.

نیـشانەکانی لـە مـرۆڤ دا: نائـارامی,لـە منداڵـدا, بـەرز بوونـەوەی کتـوپڕی پلـەی گـەرمی, خـڕ بـوونی لیمفـە گرێکـان, گـەورە بـونی جگەر و سپڵ, ئاوسانی پێڵوی چاو, لـە گەورەکانـدا زیـاتر بەشـێوەی درێژخایەنە و دەبێتە هـۆی هەو کردنـی ماسولکەی دڵ و پـەردەی مێشك.

## نەخۆشی دەردە پشیلە Toxoplasmosis

ناوی پرۆتۆزوا: *Toxoplasma gondii*

ئـەم مـشەخۆرە بەشـێوەیەکی سـەرەکی لـە پـشیلەدا هەیـە کاتێـك کیـسەهێلکەیی یـەکان (OOcyct) لـە لایـەن بـەرازەوە دەخورێـت لەڕێگای خواردن و ئـاو پـیس بـوو بـە پیـسایی پـشیلە یـان لـەڕێگای خواردنـی مشك یان هەرگیانەوەرێکی تـری تووشبوو بـەو نـەخۆشـی یە بەرازەکەش تووش دەبێت, کاتێك گۆشتی بەراز لایـەن مرۆڤـەوە دەخورێت مرۆڤ توش دەبێت,مرۆڤ دووبارە لـەڕێی خـواردن و ئـاوی پیس بوو بە پیسایی پشیلەوە تووش دەبێت.

نیشانەکانی لە بەرازدا: هەندێك جار نیشانەکانی دەرناکەوێت, کەم لەوەری , بەرز بوونەوەی پلەی گەرمی, گێژی, هەناسە سواری ,سکچوون, نیشانەکانی کۆئەندامی دەمار وەك لەرزین, هەندێك جار بەراویتە بوون.

نیشانەکانی لە مرۆڤدا: هەندێك جار نیشانەکانی دەرناکەوێت, بەرز بوونەوەی پلەی گەرمی, گێژی, سەر ئێشە, شەکەتی ماسولکەکان, هەوکردنی بۆریە لیمفیەکان ,لەبارچوونی کۆرپەلە , هەندێك جار هەووکردنی جگەر و ماسولکەکانی دڵ و مێشك.

## نەخۆشیە بەکتیریایی یەکان

### برۆسیلۆسیس (حمی المالطا) . Brucellosis

ناوی بەکتریا : برۆسیلا سویس Brucella suis

بەکتریاکە لە بەرازەوە دەگوازرێتەوە بۆ دەوروبەر بە هۆی کەلوپەلی پیس بوو بە دەردراوەکانی بەرازەوە.

نیشانەکانی لە بەراز دا: هەوکردنی گونەکان, شەلین,بەراویتە بوون ,هەوکردنی جومگەکان.

نیشانەکانی لە مرۆڤ دا: سەرئێشە, گێژبوون, لاوازی, کەمخۆری, ئازاری جومگە وئێسك و ماسوولکەکان, هەوکردنی جومگەکان, گەورەبوونی لیمفەگرێکانی مل, هەوکردنی پەردەی مێشك.

## گرانەتا . Salmonelosis

ناوی بەکتریا : . *Salmonella typhimurium*
*Salmonella entritidis*

بەراز یەکێکە لەو گیانەوەرانەی نەخۆشیەکە دەگوێزێتەوە بۆ مرۆڤ لە ڕێگەی پیس کردنی ئاو یان خۆراك بە پاشەڕۆی بەراز, یان لەرێگەی خواردنی باستورمەی بەرازەوە.

نیشانەکانی لە بەراز دا: بەرزبونەوەی پلەی گەرمی, سکچونی ئاوی, لاوازی, وشکبوونەوە, هەوکردنی ریخۆڵە, برینی ناوپۆشی ریخۆڵە, هەوکردنی سیەکان.

نیشانەکانی لە مرۆڤ دا :وەك هەمان نیشانەکانە کە لەبەرازدا دەردەکەوێت.

## سواین ئیریسیپلەس swine erysipelus

ناوی بەکتریا *Erysipelothrix rhusiopathia*

نەخۆشیەکە توشی پێستی بەراز دەبێت لەرێگای برین یان ڕوشانەوە پاشان دەگوازرێتەوە بۆ مرۆڤ بەتایبەتی ئەوانەی کە مامەڵە لەگەڵ بەراز دەکەن وەك بەرازەوان, قەساب و پزیشکی ڤێتێرنەری.

نیشانەکانی لە بەرازدا : سووربونەوەو و داخورانی پێستی سەرپشت و گوێ و لاکان، رەقبوون و ئازاری جومگەکان، هەندێ جار لەناوچوونی کتوپڕ.

نیشانەکانی لە مرۆڤدا: سووربونەوەی پێست هەوکردنی جومگەکان بەتایبەتی جومگەی پەنجەکان .

## ئەنسراکس (سپڵە قەویلە) Anthrax

ناوی بەکتریاکە: بەسیلەس ئەنپراسیس *Bacillus anthracis*

نەخۆشیەکە لەنێوان بەراز و مرۆڤە دا بەسێ شێوە دەگوازرێتەوە یان بەپێست لەرێگەی بەرکەوتن و برینەوە , یان لە ریخۆڵەکاندا لەرێگەی خواردنی سپۆری بەکتریاکەوە یان لە سی یەکاندا بەهۆی هەڵمژینی سپۆرەکانەوە.

نیشانەکانی لە بەرازدا: زۆر بەکەمی نیشانەکانی دەردەکەوێت بەلاّم هەندێ جار نیشانەکانی وەك تا, کەمخۆری, ئاوسانی قورگ, سکچونی خوێناوی, بەربوونی خوێنی کەفەلۆکاوی لە لوتەکاندا.

نیشانەکانی لە مرۆڤ دا: نیشانەکان بە گوێرەی شێوازی گواستنەوەی نەخۆشیەکە دەگۆرێت بۆ نموونە کاتێك لە لەرێگەی هەڵمژینی سپۆرەکانەوە بێت دەبێتە هۆی برین لە سی یەکان و هەوکردنی سی یەکان هاتنە دەرەوەی چڵمی خەست, یان

لەرێگـەی خـواردنی سـپۆرەکانەوە بێـت دەبێتـە هـۆی بـرین لـە ریخۆڵەکانـــدا, کـــاتێکیش نەخۆشـــیەکە بـــە بەریەککـــەوتن دەگوازرێتەوە نیشانەکانی لەسەرپێست بەشێوەی برینێکی رەشی بازنەیی لە شێوەی بورکانێکی ناوەراست چاڵ دەردەکەێت.

## کەمپایلۆبەکتیریۆسس Campaylobacteriosis

ناوی بەکتریا: *Campaylobacter jejuni*

بەراز یەکێکە لەو ئاژەڵانەی ئـەم نەخۆشیە دەگوازێتـەوە بـۆ مـرۆڤ لەرێگای گۆشتی باش نەکوڵاو و خـواردن و خواردنـەوەی پـیس بـوو بە دەردراوەکان بەتایبەت پاشەڕۆی بەراز.

نیـشانەکانی لەبـەرازدا : سك چـوونی ئـاوی, بـەرز بونـەوەی پلـەی گەرمی, کەم خۆراکی.

نیـشانەکانی لـە مـرۆڤ دا: سـك ئێـشە, سکـچوون, هەنـدێك جـار ڕشانەوە , بەرز بونەوەی پلەی گەرمی.

## ژەهراوی بوونی خۆراکی کلۆستریدی

ناوی بەکتریا : *Clostridia perfringens* type A

ئـەم جـۆرەی بەکتریایـە هەنـدێك جـار بەشـێوەیەکی ئاسـایی لـە ئاژەڵدا هەیە, بەراز یەکێکـە لـەو ئاژەڵانـەی کـە دەتوانێـت ژینگـەی مـرۆڤ بەسـپۆرەکانی ئـەم بەکتریایـە پـیس بکـات , ئـەم سـپۆرانە

کاتێك لە خواردەمەنیدا دەبێت بەرگەی پلەی کولاٌنی بەرز دەگرێ وە لەکاتی ساردبوونەوە دا دەگۆڕێت بۆ بەکتریای چالاك وەلە ماوەیەکی کەم دا زیاد دەکەن کاتێك ئەو خواردەمەنیە بەساردی دەخورێت بەکتریاکە لە ریخۆلەکاند ژەهر دەرێژن و دەبێتە هۆی ژەهراوی بوون.

نیشانەکانی لە مرۆڤ دا: لە پاش ١٠ -١٢ کاتژمێر دەبێتە هۆی سکچوون ,سك ئێشە بەلاٌم رشانەوەی لەگەلٌدا نابێت و ئەم نیشانانە ٢٤ کاتژمێر دەخایەنێت .

## سیل Tuberculosis

ناوی بەکتریا: *Mycobacterium tuberculosis*

ئەم بەکتریایە بەشێوەیەکی کەمتر توشی بەراز دبێت , لە رێگەی هەناسە وەرگرتنەوە یان هەندێك جار لەرێگەی خواردن و ئاوی پیس بوو بەم بەکتریایە نەخۆشی یەکە دەگوێزریتەوە بۆ مرۆڤ.

نیشانەکانی لە بەرازدا: گەورەبوونی لیمفەگرێکانی قورگ و لامل و هەناو تێکشکانی جوومگەکان و هەوکردنی پەردەی مێشك . نیشانەکانی کۆ ئەندامی دەمار.

نیشانەکانی لە مرۆڤ دا: دابەزینی کێش, لاوازی, کەم خواردن, تای ناوبەناو, کۆکەی تەڕی درێژخایەن, هەناسە سواری, گەورە بوونی لیمفە گرێکان.

## ستریپتۆ کۆکۆسس Streptococcusis

ناوی بەکتریا : *Streptococcus suis type II*

بـەراز توشـی ئـەم بەکتریایـە دەبێـت و دەگوێزرێتـەوە بـۆ مـرۆڤ بەتایبـەتی ئەوانـەی سـەروپێ و زمـانی بـەراز پـاك دەكـەن چـونکە بەکتریا کە لە لۆزەتەینەکانی بەرازدا دەمێنێتەوە ئەم نەخۆشیە لە ولاتە یەککگرتووەکانی ئەمـەریکا زۆرە و هـەروەها لەهـەموو ئـەو وولاتانەدا هەیە کە بەرازی تیادا بەخێو دەکرێت .

نیشانەکانی لە بەرازدا : هەوکردنی پەردەی مێشك و سی یـەکان و دڵ هەر ،ەها توشی نەخۆشی کۆئەندامی زاووزێ دەبێت.

نیشانەکانی لە مرۆڤدا : بەرز بوونەوەی پلـەی گـەرمی ، هـەوکردی جومگەکان , کەڕبوونی هەمیشەیی

## لیبتۆ سپایرۆسس(نەخۆشی وایلس) Leptospyrosis

ناوی بەکتریا: / *Leptospyra pomona*

بەراز یەکێك لەو گیانەوەرانەی کە لە ڕێگەی پیس بوونی بـرین و روشانی پێست یان پیسبوونی روپۆشی پێلۆی چاو یان لـە ڕێگـەی پیـسبونی ئـاوەوە بـە پیـسایی یـان میـزی ئـەم نەخۆشـیەوە دەگوێزێتـەوە بـۆ مـرۆڤ . خـاوەن بـەراز, قەسـاب, ئەوانـەی ئـیش لـەگوێ کـانی و روبـار و ئاوەکـان دەکـەن وپزیـشکی ڤێتێرنـەری مەترسیدارترن بۆ گرتنی نەخۆشیەکە.

نیشانەکانی لە بەرازدا: بەرزبوونەوەی پلەی گەرمی, زەردوویی. میزی خوێناوی و بەراویتە بوون.

نیشانەکانی لە مرۆڤ دا :کەم خوێنی , زەردوویی , سەرئێشە. ئازاری ماسوولکەکان, ڕشانەوە, هەوکردنی پێڵوی چاوەکان, هەندێك جار هەو کردنی پەردەی مێشك.

## Tularaemia تۆلارایمیا

ناوی بەکتریا : *Francisella ( pasteurella) tularensis*

بەکتریا کە لە ڕێگەی پێست بەهۆی مێش یان گەنە یان برین یان بەهۆی خواردنی پیس بووەوە بە بەکتریا کە دەگوێزرێتەوە ئەم بەکترایە زیاتر لە کەروێشکیشدا هەیە.

نیشانەکانی لە بەرازدا : کەم لەوەڕی , بەرز بوونەوەی پلەی گەرمی, کۆکە , هەناسە سواری , سکچوون, رەق بوونی جومگەکان.

نیشانەکانی لە مرۆڤ: ئاوسان و ئازاری شوێنی بەکتریاکە لەسەر لەش, برین و هەوکردنی لیمفەگرێکانی ئەو شوێنەی کە توشی بەکتریاکە بووە, هەوکردنی سی یەکان و قورگ, سك ئێشە و سکچوون و ڕشانەوە.

## کۆلیبەسیلۆسس Colibacillosis

ناوی بەکتریا: *Escherichia* sp.

مـرۆڤ بـە هـۆی خـواردنی خـواردن و خواردنـەوەی پـیس بـوو بـە پاشەڕۆی بەرازەکە تووشی نەخۆشی یەکە دەبێت.

نیـشانەکانی لـە بـەرازدا : سـك چونێکی سـپی شـل هەنـدێك جـار خـوێنی لەگـەڵ دەبێـت لاواز بـوون ,دابـەزینی کێـشی لـەش,تـۆپین لەماوەیەکی کەمدا.

نیـشانەکانی لـە مـرۆڤ دا: سکـچوونی ئـاووی بـۆن نـاخۆش, ووشـك بڕونەوە , دابەزینی کێش, ڕشانەوە , سك ئێشە.

## نەخۆشی یە ڤایرۆسیەکان

### هاری Rabies

ناوی ڤایرۆس: ڕەبدۆ ڤایرەس .Rhabdovirus

نەخۆشـیەکە دەگوازرێتـەوە بـۆ بـەراز لـە ڕێگـەی بـەرازێکی تـووش بوو یان گەستنی لە لایەن کەڵبەدارێکی تـوش بـووەوە بـەرازیش لـە لایــەن خۆیــەوە ئــەم ڤایرۆســە دەگوازێتــەوە بــۆ مــرۆڤ لــەڕێگای پەلاماردانەوە یان خواردن و خواردنەوەی پیس بوو بە لیکی بـەراز هەرچەندە ئەم نەخۆشیە لە بەرازدا تارادەیەك کەمەترە.

نیشانەکانی لە بەراز دا: نارێك رێك وپێکی لە رۆیشتن دا ، گێژی، دەرکەوتنی نیشانەکانی درندەیی بە روخساریەوە، ئیفلیجی، مردن.

## تەبەق Foot and mouth disease

ناوی ڤایرۆسەکە: aphthovirus

**بەراز یەکێکە لەو گیانەوەرانەی توشی ئەم نەخۆشیە دەبێت وە هەندێك جار دەگوازرێتەوە بۆ مرۆڤ لە رێگای بەریەککەوتن , هەناسەدان ,خواردنی پیس بوو بە ڤایرۆسەکە.**

**نیشانەکانی لە بەرازدا: زیاتر بەراز سمەکانی بریندار دەبێت و کەمتر نیشانەکان لەسەر ناوپۆشی دەم دەردەکەوێت، شەلین،برین لەسە رگوان و ژێر سك ,بەراویتە بوون.**

**نیشانەکانی لە مرۆڤ دا : تایەکی نزم، ووشك بونی دەم، بلق و برین لەسەر دەم و زمان و لێو و برین لە ژێر نینۆکی پەنجەکان.**

## هەوکردنی مێشکی یابانی Japanese encephalitis

ناوی ڤایرۆس: *Japanese encephalitis virus*

بەراز تووشی نەخۆشیەکەدەبێت و هەندێك جار لە رێگەی مێشوولەوە بۆ مروڤ دەگوازرێتەوە، بەم سێوەیە نەخۆشیەکە لە نێوان مرۆڤ مێشوولە بەرازدا روودەدات.

نیشانەكانی لە بەرازدا: هەوكردنی مێشك، بەراویتە بوون، زاینی پێشوەخت.

نیشانەكانی لە مرۆڤ دا: هەوكردنی مێشك، لەبارچوون، منداڵبوونی پێشوەخت.

## ئەنفلوەنزای بەراز Pig flu

ناوی ڤایرۆس: swine influenza virus

ئەنفلوەنزای بەراز نەخۆشیەكی درمی كتوپڕە توشی كۆئەندامی هەناسە دەبێت بەهۆی ڤایرۆسی ئەنفلوەنزای A جۆری $H_1N_1$،$H_1N_2$. $H_3N_1$،$H_3N_2$، $H_2N_3$ ئەم نەخۆشیە هەموو چەند ساڵ جارێك دەگوازرێتە وە بۆ مرۆڤ وە دەبێتە هۆی درمەنەخۆشی گشتگیر لە جیهاندا ئەمە جگە لەوەی ساڵانەش بەرێژەیەكی كەمتر دەگوازرێتەوە بۆ مرۆڤ . بەراز دەتوانێت توشی چەند جۆرێكی ڤایرۆسی ئەنفلۆنزا ببێت وەك ئەنفلوەنزای باڵندە و ئەنفلوەنزای وەرزی مرۆڤ و ئەنفلوەنزای بەراز بەمەش جەستەی بەراز وەك تاقیگەیەكی لێدێت بۆ تێكەڵ كردنی چەندجۆرێكی ڤایرۆسەكە كە لە توانایدایە بە پرۆسەی تێكەڵ بون و ریێكخستنەوە (reassortment) جۆرێكی نوێی ڤایرۆس دروست بكات كە لەوەپێش نەبووە و لەوانەیە

بگویزرێتەوە بۆ مرۆڤ کە هیچ بەرگربەکی نی یە بۆ ئەم جۆرە تازەیە

نیشانەکانی لە بەرازدا: بەرز بوونەوەی پلەی گەرمی، کۆکە، کەم لەودڕی، لاوازی، چڵم، رێژەی تووش بوون ١٠٠٪ رێژەی مردن ٥٪.

نیشانەکانی لە مرۆڤ دا: بەرز بونەوەی پلەی گەرمی، پژمە، کۆکە، ئازاری ماسولکە، چڵم وبەڵغەم، سوتانەوەی قورگ، سەر ئێشە، هەندێك جار سکچوون و ڕشانەوە، ڕێژەی تووش بوون لەوانەیە بگاتە ١٠٠٪ , ڕێژەی مردن ٤.١٪.

## نەخۆشی یە کەڕوویی یەکان

دێرماتۆ فایتۆسس Dermatophytosis

ناوی کەڕوو: *Tricophyton Sp. , Microsporum*

بەراز یەکێکە لەو ئاژەڵانەی کە ئەم نەخۆشیە تووشی پێستیان دەبێت وە دەگوازرێتەوە بۆ مرۆڤ لەرێگای بەریەککەوتنەوە.

نیشانەکانی لە بەرازدا: لەسەر پێستی سەرو مل و لا شانەکان بەشێوەی ناوچە ناوچەی بازنەیی دەردەکەون کە پێست و پولەکە دەردەدات و موی ئەو ناوچانە دەڕوتێتەوە .

نیشانەکانی لە مرۆڤ دا: لەسەر پێستی دەست و قوڵ و قاچەکان بەشێوەی ناوچە ناوچەی بازنەیی دەردەکەون کە پێست و پولکە

دەردەدات و ڕەنگی سور یان پەمەیی دەردەکەویت, موی ئەو ناوچانە دەڕوتێتەوە زۆر بە ئالۆشە.

## بەکار هێنانی ڕۆنی بەراز لە خواردەمەنی و بەرهەمەپیشەسازیەکان دا

بەراز ئاژەڵێکە بەخێوکردنی تاڕادەیەك لە گیانەورانی تر ئاسانترە وە بەرهەمیشی زیاترە چونکە لە لەکاتی زایین دا چەند بەچکەیەکی دەبێت وە لە ماوەیەکی کەم دا کێشی زیاد دەکات , بەخێوکردنی بەشێوەیەکی زۆر بەربلاوە لەو ولاتانە دا کە موسوڵمان نین بە جۆرێك بە سەدان کێڵگەی بەخێوکردن هەن کە بە سەدان بەرازی تیادا بەخێو دەکرێت پاشان بۆ سەربڕینخانەکان ڕەوانە دەکرێت وە لە بەر ئەوەی بەراز بەشێکی زۆری لە چەوری پێکهاتووە بۆیە بڕێکی زۆری چەوری دەسکەوتەی سەربڕینخانەکانی بەراز دەبێت کە لە پیشەسازی تردا بەکاردێت وەك پاکەرەوە و سابون و خواردنی ئامادەکراو زۆر جار ناوی لە پێکهاتەی ئەو خواردەمەنی و پیشەسازیانەدا دەبرێت کە لە ولاتە ئەوروپیەکاندایە , هەندێك جاریش لە هەندێك لە بەرهەمەکاندا کە ڕەوانەی وولاتە موسوڵمانەکان دەکرێت ناوی نابرێت چونکە لە فرۆشی ئەو بەرهەمانە کەم دەبێتەوە بۆیە بە هێما ئامارەی بۆ دەکەن بە بەکارهێنانی پیتی E و پاشگری ژمارەیەك.

بۆیـە ئـەو هێمایانــە دەخەینــە ڕوو کــە ئامــاژە بــۆ ڕۆنــی بــەراز دەکەن لـە بەرهەمەکانـدا هـەتا ئاگاداربین لـە کـاتی بـەکارهێنانی هەر بەرهەمێك یان خواردەمەنیەکدا.

E١٠١-E١٠٢-E١٠٣-E١١١-E١٢٠-E١٢٣-E١٢٤-E١٢٦-E١٢٧-E١٢٨-E١٤١-E١٥٢-E٢١٠-E٢١٣-E٢١٤-E٢٠٦-E٢٢٤-E٢٥٢-E٢٧٠-E٢٨٠-E٣٢٥-E٣٢٦-E٣٢٧-E٣٣٤-E٣٣٦-E٣٣٧-E٣٧٤-E٤٢٠-E٤٢٢-E٤٣٠-E٤٣١-E٤٣٢-E٤٣٣-E٤٣٤-E٤٣٥-E٤٣٦-E٤٤٢-E٤٧٠-E٤٧١-E٤٧٢-E٤٧٣-E٤٧٤-E٤٧٥-E٤٧٦-E٤٧٧-E٤٧٨-E٧٨٠-E٤٨١-E٤٨٢-E٤٨٣-E٤٨٨-E٤٨٩-E٤٩١-E٤٩٢-E٤٩٣-E٤٩٤-E٤٩٥-E٥٤٢-E٥٥٠-E٥٧٠-E٥٧٧-E٥٩١-E٦٣١-E٦٣٢-E٦٣٣-E٩٠٤

وە ئەم هێمایانەش گومان لێکراون کە ڕۆنی بەراز بن:

E١٠٤-E١٢٢-E١٤١-E١٥٠-E١٥٣-E١٧١-E١٧٣-E١٨٠-E٢٤٠-E٢١٤-E٤٧٧-E١٥١

مـەرج نیــە هــە رکاتێــك ئـەو هێمایانــەمان بینــی گومــان بکــەین لەبوونی ڕۆنـی بـەراز چـونکە دەبێـت ئـەو ژمارانـە دەقـاو دەق وەك خۆی بێت ، بۆ نمونـە هەنـدێك هێمـا هـەن کـە ڕەنگـن یـان مـادەی کیمیاین کە لە خواردەمەنیدا بەکاردێت و هیچ مەترسی یـەکی بـۆ سەر تەندروستی نی یەوە ڕێگەپێدراو وەك:

E١٣٢-E١٤٠-E١٦٠-E١٦١-E١٦٢-E١٧٠-E١٧٤-E١٧٥-E٢٠٠-E٢٠١-E٢٠٢-
E٢٠٣-E٢٣٦-E٢٣٧-E٢٣٨-E٢٦٠-E٢٦١-E٢٦٢-E٢٦٣-E٢٨١-E٢٨٢-E٣٠٠-
E٣٠١-E٣٠٢-E٣٠٣-E٣٠٤-E٣٠٥-E٣٠٦-E٣٠٧-E٣٠٨-E٣٠٩-E٣٢٢-E٣٣١-
E٣٣٥-E٤٠٠-E٤٠١-E٤٠٢-E٤٠٣-E٤٠٤-E٤٠٥-E٤٠٥-E٤٠٦- -E٣٣٢-E٣٣٣
.E٤٠٨-E٤١٠-E٤١١-E٤١٣-E٤١٤- E٤٢١

**هەندێك زاراوە كە ئاماژە بە بەراز یان بەرهەمەكانی دەكات**

هەندێك جار لە پیشەسازی یە خۆراكیەكاندا یان لە هەندێ خواردەمەنی ئامادەكراودا بەشەكانی بەراز بەكار دەهێنرێت بۆیە لە خوارەوە هەندێك زاراوە كە ئاماژە بۆ بەرازو بەشەكانی دەكات بە چەند زمانێك دەخەینە روو تا ئاشنا بین بە پێكهاتەی ئەو خواردەمەنیانەی بەكاریان دەهێنین.

| اسپانی | ایتالی | فەرەنسی | ئەڵمانی | ئینگلیزی | کوردی |
|---|---|---|---|---|---|
| cerdo | maiale | cochon | Schwein | pig | بەراز |
| cerdo | maiale | cochon | Schwein | hog | بەراز |
| cerdo | maiale | cochon | Schwein | Swine | بەراز |
| | | | | Boar | یەکانـــــە (نێر) |
| sembrar | seminare | semer | säen | Sow | مـــــالۆس (مێ) |
| cochinill o | porcellin o | cochon de lait | Ferkel | Piglet | پـــــەڵخ (بەچـــــکە بەراز) |
| cochinill o | porcellin o | cochon de lait | Ferkel | piggy | پـــــەڵخ (بەچـــــکە بەراز |
| carne de cerdo | carne di maiale | porc | Schweine fleisch | pork | گۆشـــــتی بەراز |
| Jamón | prosciutt o | jambon | Schinken | ham | گۆشتی رانی بەراز |
| lardo | tocino | lard | Speck | bacon | پشتەمەخزە ی بەاز |
| piel de cerdo | pelle di cinghiale | peau de porc | Schweins leder | pigskine | پێـــــستی بەراز |
| | | | | budding | باسـتورمەی خوێن |
| | | | | lard | چـــــەوری بەراز |

## هەندێك لەخواردەمەنی و پیشەسازیەكانی كە لە بەراز ئامادە دەكرێت

خوێنی مەییوی بەراز لەخواردەمەنی دا: باستورمەی خوێن (پودین) .
خوێنی مەییوی بەراز لە پیشەسازیدا: ئالفی ئاژەڵ و پەلەوەر, پەیینی كێڵگەكان, بۆیە, كەفی ئاگركوژانەوە.

چەوری بەراز لە خواردەمەنی دا: رۆنی سوركردنەوە, بۆ ناو خواردن, بنێشت, سەرووپێ.
چەوری بەراز لە پیشەسازی دا: ئالفی ئاژەڵ و پەلەوەر , رۆنی چەوركردن, سابوون, مۆم.

ئێسكی بەراز لە خواردەمەنی دا: سەروپێ, جەلاتین, چەوری.
ئێسكی بەراز لەپیشەسازی دا: كەتیرە, دەسكی كەل و پەل .

پێچكە بەراز لە خواردەمەنی دا : سەرو پێ.
پێچكە بەراز لە پیشەسازی دا : كەتیرە, جەلاتین.

گەدە : سەرو بێ و هاگز (خواردنێکی ئسکۆتلەندیە)
گەدەی بەراز لە پیشەسازیدا : هۆرمۆنی پیپسین[1]

پێستی بەراز بۆ پیشەسازی : جەلاتین و جەلی

کۆلۆن و ریخۆڵ ئەستورەی بەراز : لە خۆراکە جۆربەجۆرەکاندا
گوانی بەراز : ژەمە خۆراك.

گورچیلە : ژەمەخۆراك.
پەنکریاس : هۆرمۆنی ئەنسۆلین کە بۆ نەخۆشی شەکرە بەکاردێت[2].

---

٢ مەرج نی یە هەموو جۆرێکی هۆرمۆنی ئەنسۆلین و پیپسین لەسەرچاوەی بەرازەوە ئامادە بکرێت

# سەرچاوەکان

١.Heinrich. H.,( ١٩٨٣). The Adverse Influence of Pork Consumption on Health, Vol.١ No.

٢.Joseph, G., David, S., Robert, H., (١٩٩٩). Meat Hygiene, ١٠th Edition.

٣. Marek and voges, (١٩٩٩) medical parasitology ٨th edition.
٤.Tiborkassai. (١٩٩٩). Veterinaryheminthology, ١st Edition.
٥.The merck veterinary manual. (١٩٩٨). ٨th Edition.

٦. بورهان محمد امين, تەفسیری ئاسان بۆ تێگەیشتنی قورئان
٧. سليمان قوش (٢٠٠) حكمة و اسباب تحريم لحم الخنزير
٨. عاطف الهندي الضأن الحلال و الخنزير الحرام, لموسوعة الإعجاز العلمي في القرآن والسنة,
٩. محمد جان وهبى (٢٠٠٠) كتاب الاسلام ورسوله .